

**فیۆدۆر دۆستایوفسکی**

# خەیاڵی پیاوێکی گاڵتەجاڕ

وەرگێڕانی: هونەر شاهۆ

[redacted]

# خەیاڵـــی

# پیاوێکی گاڵتەجاڕ

نوسینی: فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

وەرگێڕانی: هونەر شاهۆ

چاپی یەکەم

٢٠١٦

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە ٥٧٩

## ناسنامەی کتێب

# خەیڵی پیاوێکی گاڵتەجاڕ

**نوسینی:** فیۆدۆر دۆستایوفسکی

**وەرگێڕانی:** هونەر شاهۆ

بابەت: ڕۆمان

**نەخشەسازی و بەرگ** : فواد کەولۆسی

**نۆبەتی چاپ:** چاپی یەکەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠١٦

**شوێنی چاپ:** چاپخانەی کەنج

**تیراژ:** ١٠٠٠

---

ناونیشان

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

## فەسڵی یەکەم:

من تاکێکی گاڵتەجاڕم. ئێستە پێم دەڵێن شێت. ئەگەر من لەبیرو بۆچونی ئەواندا هەروەکو پێشوتر بەگاڵتەجاڕ نەمابمەوە، دەکرێت ئەم ناوە تازەیە بە پێشکەوتنێك و ستایشکردنێك هەڵبسەنگێنم. بەڵام ئێستە ئیتر لەوان ناڕەنجێم، بەڵکو هەمویان ئەزیزن بۆم، هەتا کاتێك کە بەمن پێدەکەنن لەڕاستیدا ئەوە ئەو کاتەیە کە ئەوان ئەزیزتر دەبن بۆم.من دەمتوانی پەیوەست بم بەپێکەنینەکانی ئەوانەوە _ نەوەك بەخۆمەوە، ئەمەش بەهۆی گیرۆدەبونێکەوە کە لەگەڵ ئەواندا هەم بوو. ئەگەر لەساتی سەیرکردنی ئەواند هەستم بە خەم بکردبایە، لەبەر ئەوە بوو کە ئەوان بێ ئاگان لە هەقیقەت و من بەتەواوەتی لەوە بەئاگام. ئاه، چەندە سەختە کە تەنها تاکێك بیت و حەقیقەت بزانیت! بەڵام ئەوان لەمە تێنەدەگەیشتن. نا، هەرگیز لەمە تێناگەن.

جاران لەوەی کە بە گاڵتەجاڕ بهاتبامە بەرچاو، هەستم بە بەدبەختی دەکرد. نەك لەبەر ئەوەی کە وادەهاتمە بەرچاوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە لەڕاستیدا گاڵتەجاڕبوم.من هەمیشە گاڵتەجاڕبوم، ئەمەشم دەزانی، لەوانەیە لەو سەعاتەوە کە هاتومەتە دونیاوە. لەوانەیە لە کاتێکدا کە حەوت ساڵ بوم و زانیومە کە گاڵتەجارم.دواتر کە چومە خوێندنگە و لە زانکۆدا دەرسم خوێند، دەزانیت، هەرچەندە زیاتر فێردەبوم، قوڵتر دەمزانی کە گاڵتەجارم. تا کۆتا شوێنێك کە دێتە بەرچاو گوایە تەواوی زانستێك کە لە زانکۆدا دەمخوێند، تەنها لەبەر سەلماندنی ئەوەی کە من گاڵتەجاڕبوم، وجودی هەبوو.لەبارەی ژیانیشمەوە هەر بەم شێوەیە.بە تێپەڕبونی هەرساڵێك هەمان ئەو هۆشیاریەی کە لەهەستی گاڵتەجاڕبونی هەر پەیوەندیەك کە لەگەڵ خۆمدا دەرم دەخست گەشەی دەکرد و بەهێزتر دەبوو.هەموان هەمیشە پێمپێدەکەنین. بەڵام تەنانەت یەکێك لەمانە نەیدەزانی یان گومانیان نەدەکرد کە ئەگەر پیاوێك لەسەر زەوی پەیدا ببێت کە باشتر لەهەرکەسێك بزانێت کە من گاڵتەجاڕم، ئەوا ئەو کەسە خودی خۆم دەبوم.ئەو شتەی کە لەهەمو شتێك زیاتر ئازاری دەدام، ئەوە بو کە

ئەمانە ئەوە نازانن. بەڵام هەڵەکە لەخۆمدا بوو، ئەوەندە لەخۆم بایی بووم کە هیچ کاتێك شتێك ناچاری نەدەکردم کە ئەمە بەکەسێك بلێم. ئەم غرورە هەموساڵێك لەمندا گەشەی دەکرد، ئەگەر بکرابا کە مۆڵەت بەخۆم بدەم و بە هەموو کەسێك بلێم کە من گاڵتەجارم، بەڵێن دەدەم کەدەبوایە هەر لەو ڕۆژەدا مێشکم بەیەکەوە هەڵوەشاندبایەوە.

ئاه، چ ئازارێکم لەسەرەتای گەنجیەتیمدا دەکێشا، لە ترسی ئەوەی کە نەدەکرا خۆم ڕسوا بکەم و لەبەرامبەر هاوپۆلەکانمدا دانی پیادا بنێم. بەڵام کاتێك گەیشتمە تەمەنی کامل بون، ئارامتر بومەوە بەبێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانم، ئەگەر چی هەرساڵێك زیاتر هەستم بەتایبەتمەندیە ترسناکەکەی خۆم دەکرد. بەبۆنەی ئەمەوەیە کە دەڵێم هۆکارەکەی نازانم کە تاوەکو ئەمڕۆ ناتوانم بلێم بۆچی بەم شێوەیە بوو.لەوانەیە هۆکارەکەی بەدبەختیەکی ترسناك بوبێت کە لەڕۆحی مندا، لەشتێك کە زیاتر سەرەنجامی کارەکەم بو تا شتێکی تر، گەشەی دەکرد: ئەو شتە بڕوای بەهێزی من بو ئەوەبو کە هیچ شتێك لە دونیادا گرنگ نیە. من ماوەیەکی زۆر بو کە بەئاگابوم لەمە، بەڵام ساڵێك لەمەوبەر تەقریبەن یەکجار بەشێوەیەکی تەواو

هەستم پێکرد. هەستم بەوەکرد کە هیچ جیاوازیەکی نیە بۆم ئەگەر جیهان وجودی هەبێت یان ئەوەی ئەسڵەن شتێك هەرگیز وجودی نەبێت: بەتەواوی وجودمەوە بەو هەستە گەیشتم کە هیچ شتێك وجودی نیە.لەسەرەتاوە وامدەزانی کە شتانێکی زۆر لەڕابردودا وجودیان هەبوە، بەڵام دواتر دڵنیا بوم کە تەنانەت هەرگیز هیچ شتێك لەڕابردوشدا وجودی نەبوە، بەڵکو تەنها بە هۆکارێکی لەم جۆرانە وا دەهاتە بەرچاو.کەم کەم دڵنیا بوم کە تەنانەت لە داهاتوشدا هیچ شتێك نابێت و ڕونادات.

دواتر تورەبوم و وازم لەخەڵك هێناو تەقریبەن دەستم کێشایەوە لە سەرنجدان و چاودێریکردنیان. لە حەقیقەتدا ئەمە تەنانەت لە شتانێکی کەمی بێ ئەهمیەتدا خۆی پیشان دەدا: بۆنمونە، من عادەتم وابو کە لەجادەکاندا ڕوبەڕوی خەڵك ببمەوە.نەك بە ئەندازەیەك کە لەبیرکردنەوەدا ون ببم :دەبوایە بیرم لە چ شتێك بکردایەتەوە؟ تەقریبەن من تاوەکو ئەو کاتە دەستم لە بیرکردنەوە کێشابویەوە. هیچ شتێك گرنگ نەبو بۆم. ئەگەر چی لانی کەم کێشەکانمم چارەسەرکردبوو! ئاە، تەنانەت یەکێك لەوانەم هێشتا چارەسەرنەکردبو.چەندە زۆربون! بەڵام من لەنیگەرانی هەرشتێك

دەستم کێشابویەوەو هەموو کێشەکان ونبوبون.لەمە بەدواوە بۆ کەمن لەحەقیقەتەکە تێگەیشتم. من لەنۆڤەمبەری پێشوتردا لە حەقیقەتەکە تێگەیشتم _ سێی نۆڤەمبەر بوو، ئەگەر بمەوێت بەوردی بیڵێم _ هەمو ساتێکی ئەوکاتەم لەبیرە.عەسرێکی دڵگیربوو، یەکێك لە دڵگیرترین عەسرەکان کە دەتوانێت ببێت.نزیك سەعات ١١ بو کەدەمویست بڕۆمەماڵەوە، لەبیرم دێتەوە کە پێموابو ئەم عەسرە ناتوانێت دڵگیرتر لەمە بێت، تەنانەت بەشێوەیەکی فیزیکیش.تەواوی ڕۆژەکە باران باری بو، بارانێکی سارد، دڵگیر، تەقریبەن وەك دڵە خورپەیەکی هەست بزوێن وابو، بەشێوەیەك بیرم دێتەوە کە بە ڕقێکی خاڵی لەهەڵە لەسەر دژایەتی کردنی بەشەریەت هاوڕابوو. بارانەکە لەنێوان سەعات ١٠ و ١١ دا خۆشی کردەوە و بەشوێن ئەودا ئەو شێ ترسناك و ساردەی کە تەڕترە لەبارن هات، بەشێوەیەك کە هەڵم لەهەر شتێکی تر بەرزتردەبویەوە، لەهەر بەردێك لەجادەکاندا، لە هەرکۆڵانێك تا کۆڵانێکی تر، تا شوێنێك کەچاو کاری دەکرد.

بیرکردنەوەیەك بە مێشکمدا هات، ئەگەر گڵۆپەکانی سەرجادە بکوژێنەوە، کەش و هەوا کەمتر دڵگیر دەبێت، لەبەر ئەوەی کاتێك

که هەموشوێنێك ڕوناکە، هەڵم دڵی مرۆڤ زیاتر بەرەو غەمگینی دەبات. بەسەختی دەتوانرێت بوترێت که ئەو ڕۆژە چایم دەخواردەوە. شەوەکەم لەگەڵ موهەندیسێکدا بردەسەر، دوکەسی تر له هاوڕێکانی لەوێ بون. من بێدەنگ دانیشتبوم و پێموابو که ئەوان بێزار دەکەم.ئەوان قسەکانیان بەتینتر دەبوو، بەڵام من بەباشی دەمبینی که هەمو ئەمانە درۆیە.هەرئەوەندە بەوانم وت کە: ((هاوڕێیان، ڕاستیەکەی ئەوەیە ئێوە هیچ پەیوەندیەکتان بەوەوە نەبوو که وتان.))ئەوان دڵتەنگ نەدەبون، بەڵام پێمپێدەکەنین. لەبەرئەوەی له قسەکانی مندا هیچ سەرزەنشت کردنێك وجودی نەبوو، زۆر بە سادەی بیروبۆچونەکەم دەربڕی، چونکه بۆ خۆشم هەر بەو شێوەیە بوو.خۆشیان هەستیان بەم ڕاستیە کردبوو بە گاڵتە گرتبویان و پێکەنین.

هەربەو شێوەیەی که بیرم له گڵۆپەغازدارەکانی سەرجادە دەکردەوە سەیری ئاسمانم کرد. ئاسمان بەشێوەیەکی پەرێشان ڕەش بوبو. بەڵام دەکرا بەشێوەیەکی جیا هەورە شڕو وڕەکان، که لەنێوانیاندا پینه قوڵه ڕەنگ ڕەشەکان هەبو، ببینرێن.

لەپڕێکدا ئاگاداری ئەستێرەیەک بوم کەلەناو پینەکاندا بو وە بەشێوەیەکی دڵنیا دەستم کرد بە سەیرکردنی. ئەمە تەنها لەبەر ئەوەبو کە ئەم ئەستێرەیە ئەندێشەیەکی بەمن دابوو :من بڕیارمدا کە ئەو شەوە خۆم بکوژم.دومانگ پێشتر سوربوم کە ئەمکارە ئەنجام بدەم و بەتەواوی ئەو هەزاریەی کە هەمبوو هەرئەو ڕۆژە دەمانچەیەکی پڕلە زریق و بریقم کڕی و پڕمکرد.بەلام دومانگ تێپەڕی و دەمانچەکە هەر لە چەکمەجەی مێزەکەمدا بوو، ئەوەندە زۆر بێ جیاوازی بوم کە دەمویست ساتێکی جیاوازبونم بەدەسکەوت بژمێرم _ ئەمە لەبەر چی بوو، نازانم. بەرامبەر ئەمە دومانگ هەر شەوێک کە دەڕۆشتمە ماڵەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە خۆم دەکوژم. چاوەڕێی ساتێکی گونجاوبوم. لەم ڕووەوە ئەم ئەستێرەیە ئەندێشەیەکی بە من دابوو.سوربوم لەسەر ئەوەی کە ئەمشەو هەر ئەو شەوەیە. بۆچی ئەم ئەستێرەیە ئەم بیرکردنەوەی لەمندا پەروەردەکرد، نازانم.

لەهەمان ئەوساتەدا کە تێڕمابوم لە ئاسمان، کچێکی بچوک ئەنیشکێکی لێدام. جادەکە چۆڵ بوو، بەکەمی کەسێک بەدیاردەکەوت. کەمێک دورتر شۆفێرێکی تەکسی لە تەکسیەکەیدا

خەوتبوو. کچێکی منداڵی هەشت ساڵان بو کە لە چکێکی بەسەرەوە بو وە جگە لە جلێکی شڕو وڕ کە بەتەواوەتی بەهۆی بارانەوە تەڕبوبو هیچی تری لەبەردا نەبوو.بەڵام پێڵاوە دڕاوە تەڕەکانی سەرنجی منیان ڕاکێشا و ئێستەش ئەوانم لەبیرە. بەتایبەتی پێڵاوەکانی سەرنجی منی ڕاکێشا. کچەکە ئەنیشکێکی تری لێدام و بانگی کردم.نەدەگریا، بەڵام بڕگە بڕگە چەند وشەیەکی دەخستە سەر لێوی، کەبەهۆی زۆری لەرزوسەرما لە تەواوی وجودیدا، نەیدەتوانی بە شێوەیەکی ڕاست ئەو وشانە دەببڕێت.ئەو لە شتێك ترسابو بەردەوام هاواری دەکرد: ((دایکە، دایکە!)) من بەرەو لای ئەو گەڕامەوەو بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بڵێم بەردەوام بوم، بەڵام ئەو ڕایکردو خۆی بەمندا هەڵواسی، دەنگی تایبەتمەندیەکی هەبو کە لە منداڵە ترساوەکاندا واتای نائومێدبونی دەبەخشی. من ئەو دەنگەم دەناسی.ئەگەر چی ئەو شتێکی نەوت، من تێگەیشتم کە دایکی مردبوو، یان شتێك لەوجۆرە ڕویدابو بۆیان، لەوەی کە ئەو هاتبویە دەرەوە تاوەکو کەسێك بانگ بکات بۆئەوەی شتێك بۆ یارمەتی دانی دایکی بدۆزێتەوە. من نەڕۆیشتم لەگەڵیدا، بەپێچەوانەوە ئەوم لەخۆم دورخستەوە. لەسەرەتاوە پێم وت کە بڕوات بۆلای پۆلیس.بەڵام ئەو

دەستەکانی بە شێوەی ئەڵقە لێکرد، بە گریانەوە بەرەولام هات و وازی لێنەدەهێنام. ئەو کاتە من قاچم کێشا بەزەویداو هاوارم کرد بەسەریدا. ئەو بەدەنگێکی بەرزەوە وتی((ئاغا، ئاغا !. . .)) بەلاّم لەناکاو وازی لێهێنام و بەشڵەژاویەوە بەرەو ڕوی جادەکە ڕایکرد. ڕێبوارێکی تر لەوێوە دەرکەوت و وەك ئەوە وابو کە بڵێیت لەلای منەوە بەرەو ئەویٚ فڕی.

من بەرەو نهۆمی پێنجەمی ئاپارتمانەکەم ڕۆیشتم، ژورێکم هەیە لە ئاپارتمانێکدا کە لەگەڵ ئەوانی تردا نیشتەجێم.ژورەکەم بچوك و فەقیرانەیە کە پەنجەرەیەکی میچ لێژی بەشێوەی نیوبازنەی هەیە.قەنەفەیەك بەڕوکەشی خامی ئەمریکایی و مێزێك بە کتێبەوە لە بەرامبەریدا، دوکورسی و مۆبێلێك لەمۆدێلی هەژارانە کە دەتوانرێت بە شێوەیەکی کۆن و دێرینانە بێنە بەرچاوو، ئەمە هەموو ئەو شتەیە کە من هەمە.دانیشتم، گلۆپەکەم داگیرساند، دەستم کرد بە بیرکردنەوە.

لەتەنیشت ژورەکەی مندا ئەفسەرێکی خانەنشین دەژیا، سیٚ ڕۆژ بوو کە مەجلیسێکیان لە ڕابواردن پێکهێنابو هێشتاش بەردەوام بوو.ئەم ئەفسەرە شەش کەسی دەعوەت کردبوو کە هەمویان پیاوی

حەنەکچی بون، مەشروبیان دەخواردەوەو بەچەند وەرەقەیەکی کۆن یاریان دەکرد.

شەوی ڕابردو دەستیان کردبو بەشەڕکردن، من دەزانم کە دوکەس لەوانە خەریکی ڕاکێشانی قژی یەکتربون.خانمی خاوەن ماڵەکە دەیویست کە شکات بکات بەڵام لە ئەفسەرەکە دەترساو ڕێزی لێدەگرت.تەنها یەك نیشتەجێی تر لە ئاپارتمانەکەدا هەبوو، خانمێکی نیزامی، بچوك و ئەندام لاواز، کە لەڕێگەی زیارەتی پترزبۆرگدا لەگەڵ سێ مندالی بچوکیدا کە کاتێك هاتبون بۆ ئەوێ نەخۆش کەوتبوو.

هەم ژنەکەو هەم مندالەکانیشی تاوەکو حەدی مەرگ لە ئەفسەرەکە دەترسان، ئەم خانمە هەمو شەوێك بەترس و لەرزەوە بەبەردەم ئەواندا دەڕۆیشتو حاڵەتێکی خراپتر لەترس لە مندالە بچوکەکەیدا بەدیاردەکەوت.ئەم ئەفسەرە، تا شوێنێك کە دەیزانم، هەندێك کات خەڵکی لە نێڤسکی پرۆسپێکت دەگرت و داوای سواڵی لێدەکردن، ئەوان بەهیچ شێوەیەك خزمەتی ئەویان نەدەکرد، بەڵام شتە سەیرەکە لێرەدایە (لەبەرئەوەی کە ئەمە دەڵێم)، هەمو ئەو مانگەی کە ئەفسەرەکە لێرە بوە کردەوەکانی هیچ ئازارێکیان بەمن

نەگەیاندبوو. حەتمەن من لەسەرەتاوە هەوڵم دابو کە لە هاتوچۆکردن خۆ پارێزی بکەم، ئەو لەبەر ئەمە هەر لەسەرەتاوە تاقەتی لەگەڵ مندا نەبوو، بەڵام من هەرگیز بەلامەوە گرنگ نەبو کە ئەمانە چەندە لەلای ئەم دیوارەوە هاوار دەکەن یان ئەوەی کە چەند کەس دەبن. من تەواوی شەو بەخەبەرم و بەتەواوەتی ئەوان لەبیر دەکەم بەشێوەیەك کە تەنانەت دەنگیان نابیستم.

من تاوەکو بەیانی ناخەوم و ساڵیی پێشوش هەر بەم شێوەیە تێپەڕی.تەواوی شەو لەسەر مۆبێلەکەم لەپشت مێزەکەمەوە دادەنیشم و هیچ ناکەم. تەنها بە درێژای ڕۆژ کتێب دەخوێنمەوە. دادەنیشم _ تەنانەت بیریش ناکەمەوە، شێوەی وەکو ئەوانە لە زهنی مندا سەرگەردانن و من مۆڵەتیان پێدەدەم کە بێن و بچن و ئەوانیش دێن و دەچن. هەرشەوێك یەك گڵۆپی تەواو دەسوتێت. من بەبێدەنگی لەپشت مێزەکەوە دادەنیشم، دەمانچەکە دەهێنمە دەرەوەو لەبەردەم خۆمدا دایدەنێم. کاتێك دەمانچەکەم خستە سەرمێزەکە لەبیرمە کە لەخۆمم پرسی، (( ئایا ڕاستە؟)) بەباوەڕێکی بەهێزەوە وەڵامم دایەوە، ((ڕاستە)). ئەوەی، کە پێویستە خۆم بکوژم.

من بەدڵنیاییەوە دەمزانی کە ئەو شەوە دەبوایە خۆمم بکوشتایە،

بەڵام ئەوەم نەدەزانی کە دەبێت چەندەی تر بەردەوامی بەدانیشتن

بدەم لەپشت ئەم مێزەوە.بەڵام بێشک ئەگەر لەبەر ئەو کچە نەبوایە،

دەبوایە خۆم بکوشتایە.

فەسڵی دووەم :

دەبینیت، ئەگەر کەسێك منی بێزار بکردبایەو ئازاری بامایە، دەمتوانی بەشێوەیەك هەست بە ئازارەکەی بکەم، ئەگەر چی هیچ شتێك گرنگ نەبو بۆم. لەڕوی ئەخلاقیشەوە هەر بەم شێوەیە بوو، ئەگەر ڕوداوێکی دڵتەزێن ڕویدابایە، دەبوایە هەستم بەخەمباری بکردبایە ڕێك بەو شێوەیەی کە لەڕۆژە کۆنەکاندا فێربوبوم و خوم پێوە گرتبوو، ئەو کاتەی کە شتانێك لە ژیاندا وجودیان هەبو هەروەها بۆم گرنگ بون.ئەو ڕۆژە عەسر هەستم بە خەمباری دەکرد. بەدڵنایەوە دەبوایە من یارمەتی یەك منداڵم دابایە. کەواتە بۆچی یارمەتی کچەکەم نەدا؟ لەبەر ئەو ئەندێشەیەی کە لەو کاتەدا بە زهنمدا هات: لەکاتێدا کە بانگی دەکردم و دەیکێشام، پرسیارێکم بۆ دروست بو کە نەمتوانی وەڵامێکی بۆ بدۆزمەوە. پرسیارێك کە بە شێوەیەك بێهودە بوو، بەڵام منی ئازار دەدا.دلگران بوم بەهۆی ئەو

بیرکردنەوەی کە ئەگەر ئەو شەوە قەرار بێت کۆتایی بەژیانی خۆم بێنم، نابێت لەژیاندا هیچ شتێك گرنگیەکی بۆم هەبێت. بۆچی بەو شێوەیە بو کە هیچ هەستێك لە دەردو ڕەنجێکی سەیرو تەواو نەناسراوم لەگەڵ بارودۆخی خۆمدا نەبوو.ڕاستیەکەی باشتر لەمە نەمدەزانی کە چۆن هەستی تێپەڕبونی ئەوساتە بگوێزمەوە، بەڵام ئەو هەستەی کە زەمانێك لەماڵەکەدا لەپشت مێزەکەوە دادەنیشتم هەر بەردەوامی هەبوو، من زۆر دڵتەنگ دەبوم کە بۆچی لەڕابردودا ماوەیەکی دورودرێژ هەبو کە من بەوجۆرە نەبوم.بیرکردنەوە بە شوێن بیرکردنەوەدا دەهات.بەوجۆرە دەمبینی بۆماوەیەکی زۆر کە هێشتا ئینسان بوم و پوچی ڕوی تێنەکردبوم، زیندوبوم و بەرامبەر ئەمە دەمتوانی ئازار بکێشم، توڕە ببم و لە کارەکانمدا هەست بە شەرمەزاری بکەم. بەم جۆرە نەبوو. بەڵام ئەگەر قەرار بێت یان وایدابنێین کە لەماوەی دووسەعاتدا خۆم بکوژم، کچەکە چ پەیوەندیەکی بە منەوە هەیە و من بۆچی شەرمەزاربم یان هەرشتێکی تر لە جیهاندا؟ لەو کاتەدا هەستی دڵسۆزی منی گرتبویەوە و بە تەواوەتی ئاگام لە پەستی کردەوەکانم بوو. لەم کاتەدا کە لەبەرامبەر مەرگدا قەرارم دابوو، تەنها بەوە دڵخۆش بوم

کە چەند سانیەیەکی تر هەمو شتێك لە ئاواتی نەبونیدا تیادەچێت، نەمدەتوانی کردەوە نائینسانیەکەی خۆم بە ئینسانیانە هەڵبسەنگێنم.ئەمە تەجروبەیەکی تازە بوو و ئەم بیروباوەڕە نادیارو نەزانراوە بوو کە منی هاندا تاوەکو بە شێوەیەکی توڕەو وەحشناك لەگەڵ ئەو کچەدا ئاوەها ڕەفتاربکەم. قاچ بکێشم بە زەویەکەداو بەسەر کچە بچوکە غەمگینەکەدا هاواربکەم وەکو بڵێیت _ نەك تەنها هەستم بە خەم نەکردوە، بەڵکو حەتا ئەگەر ڕەفتارەکەم نائینسانی و دزێوانە بوە، من ئازادم کە ئەم ڕەفتارەم هەبێت، لەبەر ئەوەی لە دوو سەعاتی تردا هەموشتێك بێدەنگ دەبێت. ئایا بڕوا بەمە دەکەیت؟ لەبەر ئەمە بو کە من هاوارم کرد بەسەریدا! من تەقریبەن ئێستە ڕازیم. ئێستە بۆم دەرکەوتوە کە ژیان و جیهان بەشێوەیەك پەیوەست بون بەمنەوە، وەکو وابێت کەجیهان تەنها بۆمن دروست بوبێت: ئەگەر خۆم بکوشتبایە جیهان لانی کەم لە بونی بۆ من دوبارە دەمایەوە. ئەوە دەڵێم کاتێك کە من ڕۆیشتم، هیچ شتێك لە بونی یان هیچ شتێك بۆ کەسێك وجودی نابێت، ئەمەش بەهۆی خامۆش بونی هۆشیاری منەوە هەروەها هەموو جیهانیش ون دەبێت، هەروەك تارمایەك ناوەوەی خاڵی دەبێت، تەنها بەشێك لە

هوشیاری من، لەبەرئەوەی لەوانەیە هەمو ئەم جیهانەو هەمو ئەم خەڵکە تەنها خودی من بن. لەبیرمە هەربەوجۆرەی کە دانیشتبم و بیرمدەکردەوە، هەمو ئە پرسیارانەی کە یەك لە دوای یەك هجومیان دەهێنا بەرەو لایەکی تر بردمن و دنەم دان، بیرم لە شتێکی تەواو و تازە کردەوە. بۆنمونە، بیرکردنەوەیەکی سەیر بەمێشکمدا هات، ئەگەر لە پێشوترا لەسەر مانگ یان مەریخ بژیابامایە ئەو کاتە توشی خەفەت ترین و ناشیاوترین کردەوە دەبوم، هەروەها دوچاری شەرمەزاریەك و سوك وزەبونیەك دەبوم کە تەنها لە خەو و کابوسدا دەکرێت بیهێنیتە بەرچاوت، ئەگەر دواتر خۆم لەسەر زەوی بدۆزیبایەتەوە، دەمتوانی ئاگاداری ئەو کارانەم بم کە لە شوێنێکی تر ئەنجامم داون، لەناو ئەم تەنیایەدا دەمزانی کە نابێت هەرگیز لەژێر هیچ مەرجێکدا بگەڕێمەوە بۆ ئەوێ، لەوکاتەدا کەسەیری مانگم دەکرد لەسەر زەوی ئایا دەبوایە گرنگیم پێبایە یاخود نا؟ ئایا دەبو بەهۆی ئەم کردەوەیە هەستم بە شەرمەزاری بکردبایە یاخود نا؟ ئەمانە چەند پرسیارێکی بێهودەو زیادە بون لەبەر ئەوی ئێستەش دەمانچەکە هەر لەبەردەممدا بوو، من لەهەر تانوپۆیەکی وجودی

خۆمدا دەمزانی کە ئەم کردەوەیە حەتمەن پەسەند دەکرێت، بەلاَم ئەوان سەیریان لێدەهات و منیش تورەدەبوم.

ئێستە بەبێ ئەوەی لەسەرەتاوە شتێك داوابکەم نەمدەتوانی بمرم. بەکورتی، کچەبچوکەکە منی ڕزگارکردبوو، بۆچی من تەقاندنی فیشەکەکەم لەبەر ئەم پرسیارە دواخست. لەم بەینەدا دەنگەدەنگی ژوری ئەفسەرەکە مرکابویەوە: ئەوان یاریەکەی خۆیانیان تەواو کردبو وە ئامادە بون بۆ خەوتن، لەم کاتەدا بۆڵەبۆڵ کەرەکان و خەواڵوەکان کۆتایان بە دەمەتەقێکانیان هێنابوو.لەوکاتەدا بۆیەکەمجار لەپشت مێزەکەوە خەوم لێکەوت و شتێك کە هەرگیز پێشتر بۆ من ڕوی نەدابوو.بەهۆی زۆری خەوەوە تەواو بێدەرەتان کەوتم.

خەیاڵەکان، هەربەو شێوەیەی کە هەمومان دەزانین، شتانێکی زۆر سەیرن: بەشێك لەوانە بە ڕونیەکی ترسناکەوە دەردەکەون، بەچەند وردەکارییێکەوە گەشە دەکەن.بەشێوەیەك کە ئیتر بەشێك لەوانە دەکرێت بەخێرایەکی زۆرەوە بڕۆن، وەك بلێیت بەبێ چاودێری کردن لێیان، بەجۆرێك کە دەتوانن لە کات و شوێندا بپەڕێنەوە. وادێتە بەرچاو کە خەیاڵەکان نەك بە هۆکار بەلکو بە مەیل و خواست

دنه دەدرێن، نەك بەمێشك بەڵكو بە دڵ، ئاه، عەقڵی من لە خەیاڵدا چ بەهانەیەكی بەنی ئیسرائیلی لێ گرتوم !، لە لایەكی ترەوە چەند شتانێكی نەگونجاو دێتە پێشەوە بۆ ئەوان! بۆنمەنە، براكەم پێنج ساڵ لەمەوبەر مرد. هەندێك جار خەیاڵی ئەو دەكەم، ئەو هاوبەشی دەكات لە كارەكانی مندا، ئێمە زۆر بەیەكەوە گیرۆدەین، هێشتا لەهەمو خەیاڵەكەمدا بەتەواوەتی دەزانم و لەبیرمە كە براكەم مردوەو لەژێرخاكدایە.

ئگەرچی ئەو مردوە، لێرە لەگەڵ مندایەو لەگەڵم كاردەكات، چۆن دەكرێت كە من سەیرم لێنەیێت؟ بۆچی بەم شێوەیە مەنتیقی من بەتەواوەتی ئەمە پەسەند دەكات؟ بەلاَم ئەمە بەسە، لەخەیاڵەكەمەوە دەست پێدەكەم، بەڵێ، خەیاڵێكم بینی، خەیاڵی سێی نۆڤەمبەری من. ئەمانە ئێستە سەردەخەنە سەرم و دەڵێن ئەمە تەنها خەیاڵێك بوە.بەلاَم ئایا جیاوازیەكی هەیە كە ئەمە خەیاڵێكە یان واقیعیەت، ئەگەر من خەیاڵەكەم بە حەقیقەت بزانیبایە؟ ئەگەر بۆیەك جار كەسێك حەقیقەتی بینیبایە و بیناسیبایە، دەیزانی كە ئەمە حەقیقەتە چ ئێوە خەوتبن یان بە ئاگابن، هیچ شتێكی تر نیەو ناتوانێت هەبێت، بەرامبەر ئەمە بهێڵن

که ئەمە یەك خەیاڵ بێت، هەربەو شێوەیەی کە هەیە، بەڵام ئەو ژیانە واقیعیەیی کە زیاتر ئێوە دروستی دەکەن من دەمویست بە خۆکوژی خامۆشی بکەم.

بەڵام ئەم خەیاڵە !، ئەم خەیاڵە _ ئاە، چ ژیانێکی جیاوازی بەمن بەخشی، تازە، لێوان لێو لە شکۆ و هێز! گوێ بگرن.

## فەسڵی سێهەم :

لەبیرمە کە لە پڕێکدا خەوم لێکەوت و تەنانەت وادەهاتە بەرچاو کە هێشتا بیرم لەیەك شت دەکردەوە.خەوێکم بینی کە تیایدا دەمانچەکەم هەڵگرت و ڕێك نیشانەم لە دڵی خۆم گرت _ دڵم، نەوەك سەرم.پێشوتر لەوە سوربوم کە تەقە لەسەرم بکەم، لە لاجانی لای ڕاستم. دوای نیشانەگرتن بەرەو سنگم یەك دودەقیقە سەبرم کرد، لەپڕێکدا گڵۆپەکە، مێزەکە، دیوارەکە لەبەرچاومدا دەستیان کرد بە جوڵەو پەلەقاژە کردن.بۆ ڕاکێشانی پەلەپیتکەکە پەلەم کرد.ئێوە لەخەودا هەندێك جار لەشوێنێکی بەرزەوە دەکەونە خوارەوە، یان لەوانەیە چەقۆتان لێبدرێت، یان لەبارەی لێدان و جنێودانەوە ڕۆڵ ببینن، بەڵام هەرگیز هەست بە ئازار ناکەن، مەگەر ئەوەی کە خۆتان بکێشن بە تەختی نوستنەکەدا، لەو کاتەدایە کە

هەست بە ئازار دەکەن و زیاتر لەوجۆرە کاتانەدایە کە لەخەو

دەردەپەڕن. خەوەکەی منیش هەربەم شێوەیە بوو. هەستم بە هیچ

ئازارێك نەدەکرد، بەڵام وەکو وادەردەکەوت کە تەقەکردنەکەم هەمو

ئەندامەکانی لاشەمی لەرزاندوە، هەموشتێك ڕەش و تاڵ بوو،

دەوروبەرم بە ڕەشیەکی ترسناك داگیرا.وادەردەکەوت کە

کوێربوبوم، بێ هەست بوبوم، لەسەر شتێك بەدرێژی ڕاکشابوم و

کەمەرم دەکێشراو دەچەمیەوە، هیچ شتێکم نەدەبینی و نەمدەتوانی

بچوکترین جوڵە بکەم.لەدوری منەوە خەڵك دەڕۆیشتن و

هەمهەمەیان دەکرد، ئەفسەرەکە هاواری دەکرد، خانمی خاوەن

ماڵەکە دەیقیژاند _ دواتر لە یەك سانیەدا هەموو دەنگەکان خامۆش

بون و من لەتابوتێکی داخراودا دەگوازرامەوە.هەستم بەوەدەکرد کە

چۆن تابوتەکە دەجوڵێت و بیرم لێ دەکردەوە، بۆیەکەمین جار

ئەوبیرکردنەوەیە بە مێشکمداهات کە مردبوم، تەواو مردوو، من

ئەمەم دەزانی و هیچ گومانێکم نەبوو، نەدەمتوانی ببینم و بجوڵێم،

بەم حاڵەشەوە هەستم دەکرد و بیردەکردەوە. بەڵام زۆر زوو خوم

بەم جۆرە دەرفەتەوە گرت، هەربەوشێوەیەی کە زیاتر لەخەودا

پەسەندم دەکرد، ڕاستیەکەم بەبێ هیچ شتێك پەسەند کرد.

ئێستە لەناو زەویدا دفن کرابوم.ئەوان هەموویان ڕۆیشتن، من بەتەنها مامەوە، تەنهای تەنها.نەدەجولاّم.پێشوتر هەرکاتێك کە دفن کردنم دەهێنایە بەرچاوم تەنها هەستێك کە لەگەڵ گۆڕدا دەمبینی، هەستی شێداری و ساردی بوو.بەرامبەرئەمە ئێستە هەستم دەکرد کە زۆر سەرمامە، بەتایبەتی نوکی پەنجەی قاچەکانم، بەلاّم هەستم بەهیچ شتێکی ترنەدەکرد.

بەبێ جوڵە درێژ ڕاکشابووم، سەیر لەوەدا بوو کە من چاوەڕێی هیچ شتێك نەبووم، بەبێ هیچ شتێك پەسەندم کرد کە پیاوێکی مردوو نابێ شتێکی بۆ چاوەڕوانکردن هەبێت. بەلاّم شێدار ببووم. نازانم چەند لە زەمەن تێپەڕیبوو، یەك کاتژمێر یان چەند ڕۆژێك، یان چەند ڕۆژێکی زیاتر. بەلاّم دڵۆپێك ئاو ڕێگەی خۆی لەنێو کەلێنی تابوتەکەدا کردەوە و بەسەر چاوی چەپمدا تکا. بەشوێن ئەم دڵۆپەیەدا دڵۆپەی دووەم دوای یەك دەقیقە تکا، سێیەم یەك دەقیقە دواتر_بەم ڕێکخستنە هەر دەقیقەیەك بەشێوەیەکی ڕێك و پێك دڵۆپێك دەتکا. لە دڵمدا تووڕەییەکی قوڵ داگیرسا و لە پڕ هەستم بەو گزانەوەیە کرد لە ئازاری فیزیکی. بە خۆمم وت: ((لەبەر ئەو برینەیە کە بە هۆی گوللەکەوە دروست بووە... )) دڵۆپەی یەك بە دوای یەك

له هەر دەقیقەیەکدا دەتکا بەسەر پێڵووەکانمدا و منیش هیچم لەدەست نەدەهات. لە پڕێکدا تەواو توڕەبوم، هێزێك کە هۆکاری ئەم شتنانە بو و ئەمەی هێنابویە پێشەوە بۆم بانگم لێی کرد: ((هەر کەسێکی، گەر بوونت هەیە، گەر شتێك گونجاوتر لەمە لێرە ڕوو دەدات و دەکرێت، ئازار بکێشە و ئامادەبە. بەڵام گەر تۆڵەی خۆت لە من وەردەگریتەوە بە هۆی خۆ کوژییە گێلانەکەم و لەبەر بێشەرمیی پووچی وجوودمەوە، کەواتە لێگەڕێ پێتبڵێم کە هیچ ئازارێك ناتوانێت لەگەڵ ئەم سووکی و سەر شۆڕییەدا ڕکابەری بکات کە من ناچاربم ئەحمەقانە ئەم هەستەم هەبێت، ئەگەرچی ئەم ئازارە ملیۆنەها جار توندتر بێت و هەزاران ساڵ درێژە بکیشێت.))

من ئەمەم ئاشکرا کرد و لە ئارامیی خۆم بە ئاگا بووم. دەقیقەیەکی تەواو بێدەنگییەکی نەشکێنراو باڵی بەسەر فەزاکەدا کێشا و دووبارە دڵۆپێکی تر تکا، بەڵام من بە دڵنیایەکی بەهێزی بێ سنوورەوە دەمزانی کە هەموو شتێك بە خێرایی دەگۆڕێت. ئەوەی کە گۆڕەکەی من گەورە بووبوو، بە جۆرێك کە نازانم تێك درابوو نیان هەڵکۆڵرابوو، بەڵام من لەگەڵ بوونەوەرانێکی ڕەش و نەناسرا ودا ڕوو بە ڕوو بوومەوە، خۆمان لە ئاسماندا دۆزییەوە،

لەپڕێکدا بینینی خۆمم دەست کەوتەوە. لە کۆتاییدا شەو بوو و وە هەرگیز، هەرگیز تاریکییەکی وەها نەهاتبوویە پێشەوە. ئێمە لەهەوادا دەفڕاین و لەزەوی دوردەکەوتینەوە. هیچم لەو بونەوەرانە نەپرسی کە منیان دەبرد لەگەڵ خۆیاندا، مەغرور بوم و چاوەڕێم کرد.دڵنیاییم دا بەخۆم کە ناترسم.بە بێئاگایەوە لەو بیرکردنەوە هەیەجانیەدا بوم کە ناترسم.نازانم لەکەیەوە بو کە دەستمان کردبو بە فڕین.نەمدەتوانی بیهێنمە بەرچاوم، هەربەو شێوەیە ڕوداوەکە ڕویدا کە هەمیشە لە خەیاڵەکاندا، لەکاتێکدا کە لەزەمەن و ئاسمان و یاساکان و بیرکردنەوەو وجود تێدەپەڕی، دەیتە پێش چاوو.تەنها لە نوکتەیەکدا دەوەستیت کە دڵ ئارەزویان دەکات.لەبیرمە لە ماوەی سانیەیەکدا ئەستێرەیەکم لە تاریکیدا بینی.بەئارامی، لەگەڵ ئەو بیرکردنەوەدا کە مەبەستم پرسیارکردن نەبوو پرسیم ((ئایا ئەمە ئەستێرەی سەگی گەورە[1] نیە؟ )).

---

(1) ئەستێرەی سەگس گەورە یەکێکە لە کۆمەڵەی ئەستێرەکانی گەردون، درەوشاوەترین ئەستێرەیە لە ئاسماندا کە ڕەنگێکی سپی پاکی هەیە و زۆر لە خۆر ڕوناکترە...

((نا، ئەمە ئەو ئەستێرەیە کە ئێوە لەکاتی گەڕانەوەتان بۆ ماڵەوە لەنێوان هەورەکاندا بینیتان، ئەمە وەڵامێك بو لەلایەن ئەو بونەوەرەوە کە منی دەبرد.))

دەزانم کە دەموچاوی وەك ئینسان وابوو.سەرسامیەکە لێرەدابوو کە من ئەو بونەوەرەم خۆش نەدەویست، لە ڕاستیدا بەتوندیی هەستم بە بێزاری دەکرد لەگەڵیدا. من چاوەڕوانی نەبونی تەواوەتی بوم و لەبەر ئەمە بو کە گوللەکەم نا بە دڵی خۆمەوە.لەناو دەستی ئەوبونەوەرەدا کە ئینسان نەبو خۆمم دۆزیەوە، ئەڵبەتە هێشتا دەژیام و وجودم هەبوو.

لەگەڵ ئەو پوچیەی کە لە خەیاڵەکاندا وجودی هەیە بە خۆمم وت: ((کەواتە لەبەرانبەر ئەمەدا لەلای ئەم گۆڕەوە ژیان بونی هەیە.))

بەڵام لە قوڵای دڵمدا هەستم بە گۆڕانکاری نەدەکرد. بیرم کردەوە: (( ئەگەر ناچاربم کە دوبارە بەدیهێنەربم، جارێکی تر لە ژێر چاودێری هێزێکی سەرسەختدا بژیم، ئیتر سوك و شکست خواردو نابم.))

له ڕێگادا بە هاوڕێکەمم وت: (( ئێوە دەزانن کەمن لە ئێوە دەترسم ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە من بە سوک دادەنێن))، ، هەستم دەکرد کە سوکایەتی کردنی من هەروەکو بزمارێك وایە کە لەناو دڵمدا دێت و دەڕوات و ئازارم دەدات.

ئەو وەڵامی پرسیارەکەی منی نەدایەوە، بەڵام هەستم بەوەکرد کە ئەو تەنانەت هەر سوکایەتی بەمن نەکردوە، بەڵکو پێمپێدەکەنی و هیچ دڵسۆزیەکی بۆ من نەبوو، ئەوەی کە سەرنجی منی ڕادەکێشا ئەو سەفەرە نەناسرا و ڕەمزاویە بوو.شتێکی بێدەنگ و بە ئازار لەنێوان من و هاوڕێ بێدەنگەکەمدا لە پەیوەندیدا بو کە لە تەواوی وجودمدا دزەی دەکرد.ئێمە لەتاریکیدا دەفڕاین، لە ئاسمانێکی نەناسراودا.ماوەیەکی زۆر بو کە وێنەی گەردونی ئاشنام بەچاوەکانم نەبینی بوو.دەمزانی کە چەند ئەستێرە لە ئاسمانی ئیلاهیدا هەن کە ڕوناکیەکەیان هەزاران ساڵ یان ملیۆنەها ساڵ درێژە دەکێشێت تا دەگەنە زەوی. لەوانەیە ئێمە بە تازەی بەم ئاسمانەدا تێپەڕیبین.

من چاوەڕێی شتێك بوم کە دڵە خورپەیەکی ترسناك ئازاری دڵمی دەدا و تۆقابوم لە هەستێکی ئاشنا کەمنی بەرەو قوڵای دەبرد: چاوم بە خۆرەکەی خۆمان کەوت! دەمزانی کە ئەمە ناتوانێت

خۆرەکەی خۆمان بێت، کە ژیانی بە زەوی دەدا، ئەوەی کە ئێمە لەمەودایەکی بێسنور لە خۆرەکەمانەوە بوین، بەلام بەهۆکارێك کە ئەواوی وجودمی گرتبویەوە دەمزانی کە ئەوە خۆربوو، ڕێك وەکو ئەوەی خۆمان، کۆپیەك لەوو.

هەستێکی شیرین لەدلمدا بەبێ ئاگایەوە پێچەوانە بویەوە: هێزی هاوچەشنی هەمان ئەو تیشکەی کە ڕوناکی بەمن بەخشی بو پێچەوانەیەکی لە دلمدا داناو هەلیساندەوە. من بۆیەکەمین جار کاتێك کە لەگۆڕدابوم هەستی ژیانم هەبوو.

هاوارم کرد:((بەلام ئەگەر ئەمە خۆرە، ئەگەر وەکو خۆرەکەی خۆمانە، کەواتە زەوی لە کوێیە؟))

هاوڕێکەم ئیشارەتێکی بۆ ئەستێرەیەکی دورە دەست کرد، کە بە تیشکێکی ڕەنگ سەوزی زمرووتی دەدرەوشایەوە. ئێمە ڕاستەو خۆ بەرەولای ئەو دەڕۆیشتین.

((ئایا ئاوەها دوبارەبونەوەیەك لە جیهاندا دەڕەخسێت؟ ئایا ئەمە دەیتوانی یاسای سروشت بێت؟... ئەگەر ئەوەی کە لەوێیە زەویە، دەکرێك ڕێك وەکو زەویەکەی ئێمە بێت؟ ئایا ئەم زەویەش گرفتاری هەژاری و بەدبەختیە؟ بەم حالەشەوە دانیشتوانی چۆن خۆشیان

دەوێت و ستایشی دەکەن؟ ئایا ئەم زەویە لە ناسوپاسگوزاری منداڵەکانیدا هەر ئەو عەشقەیان بۆ دروست دەکات کە ئێمە لەبارەی زەوی خۆمانەوە هەستی پێدەکەیین؟ )) پەشۆکابوم بە شێوەی عەشقێکی سەرسەخت، بانگی ئەو زەویە ناسراوە دێرینەم کرد کە جێم هێشتبوو. وێنەی منداڵێکی هەژار کە لە خۆمم دورخستبویەوە بە مێشکمدا تێپەڕی.

هاوڕێکەم بە شێوەیەك کە ئاوازێکی خەماوی لە دەنگیدا بو وەڵامی دایەوە: ((خۆت هەموو شتێك دەبینیت.)) بەڵام ئێمە بە خێرای نزیکی تەنە ئاسمانەکە دەبوینەوە. ئەم تەنە ئاسمانیە لەبەرچاومدا لە حاڵەتی گۆڕاندابوو. ئێستە دەمتوانی ئۆقیانوسەکە بناسمەوە، هێڵێك کە ئەوروپای دروست دەکرد. لە پڕێکدا هەستێك لە ئیرەیەکی پیرۆز لە دڵمدا داگیرسا.

((چۆن دەتوانرێت دوبارە بێتەوەو بۆچی؟ من عەشقم دەڕشت و تەنها دەمتوانی عەشق بەزەویەك بدەم کە جێم هێشتبوو، زەویەك کە بەخوێنی من تێکەڵ بوبو، لەکاتێکدا؛ بە ناشوکری خۆم، ژیانم بە گوللەیەك لەناو دڵمدا خامۆش کرد. بەڵام من هەرگیز، هەرگیز لە عشقدان بەو زەویە دەستم نەکێشابویەوە، لەوانەیە لەو شەوەدا کە

زەویم بەجێهێشت ئەوم زیاتر لەهەمیشە خۆش ویستبێت. ئایا ئازار کێشان لەم زەویە تازەدا وجودی هەیە؟ لەزەوی خۆماندا تەنها بە ئازار کێشان و لەڕوی ئازارەوە دەتوانیت عەشق بدەیت.بەشێوەیەکی تر ناتوانیت عەشق بدەیت، عەشقێك لە جۆرێکی تر ناناسین. من ئازار کێشانم لەبەر خاتری عەشق دەوێت.من چاوەڕێی دەکەم و تینوی ئەو ساتەم، کە بەفرمێسکەکانم ماچی ئەو زەویە بکەم کە تەرکم کردبوو، نامەوێت، پەسەندی ناکەم ژیان لەسەر زەویەکی تر! ))

بەڵام هاوڕێکەم منی بەجێهێشتبوو.بێئاگا، بەبێ ئەوەی تێبگەم کە چۆن و کەی منی بە جێهێشتوە، خۆم خستە سەر ئەم زەویە بێگانەیە کە تیشکی ڕۆژی بەهەشتی لێیی دەدا، پێموابو لەسەر یەکێك لە دورگەکان کە لەسەر زەوی خۆمان کۆ دورگەی یۆنانیان پێکدەهێنا، یان لەکەنار دورگەی ئەسڵیدا کە بەرامبەر کۆدورگەکان بوو، ڕاوەستاوم.

ئاه، هەموشتێك بەوردی هەر بەو شێوەیە بو کە لەزەویەکەی خۆماندا هەیە، تەنها وادەهاتە بەرچاو کە هەمو شتێك قسە لە پیرۆزیەکی گەورە دەکات، لەکۆتایدا جوانیەکی پیرۆزی گەورەی

بەمن بەخشی.دەریایەکی لاوێنەر، سەوز هەروەک زمرووت، بەنەرمی

بەرەو ڕوی کەنارەکە دەپرژا و بە ئاشکراو بە عەشقێکی بە ئاگاوە

ماچی دەکرد. درەختەکان بەرزو خۆشویستراو، شکۆی خونچەکانیان

قەدیان هەڵدابوو.گەڵا هەرەزۆرەکانیان سڵاویان لە من دەکرد،

دڵنیابوم، بە خشەخشی نەرم و لاوێنەرەکەیان دەردەکەوت کە

وشەی عەشق بەیان دەکەن. سەوزایی بە گوڵە جوان و بۆندارەکان

دەدرەوشایەوە. باڵندەکان دەستە دەستە لە ئاسماندا دەفرین.

بەبێ ترس لەسەر شانەکانم و قۆڵەکانم دەنیشتنەوە و شادومانە

منیان بە باڵە عاشقانەکانیانەوە دەلاواندەوە. کۆتایەکەی خەڵکی

سەر ئەم زەویە شادەم بینی و ناسیمن. خۆیان دەهاتنە پێشوازیم،

دەوریان دام و ماچیان دەکردم. منداڵە هەتاویەکانیان،

هەتاویەکانیان، ئاه، چەندە جوان بون!

هەرگیز لە زەویەکەی خۆماندا ئاوەها جوانیەکم لە بەشەریەت

نەبینی بوو.لەوانەیە تەنها لە منداڵەکانماندا، کاتێك کە زۆر بچوکن،

دەکرێت دەنگدانەوەیەکی کەم و بەشێك لەم جوانیە

بدۆزیتەوە.چاوەکانی ئەم خەڵکە شادە بە ڕوناکیەکی ئاشکراوە

دەدرەوشایەوە.دەموچاوەکانیان درەوشاوە بوو لە ڕوناکی عەقڵ و

شعور وە لێوان لێو لە ئارامیەك كە لە فامێكی كاملەوە دەهات.بەڵام ئەم دەموچاوانە سەرخۆش بون، لە دەنگ و وشەكانیاندا ئاوازێك لە شادی منداڵانە هەبوو.ئاه، لەیەكەمین ساتەوە، لەیەكەمین سەیركردنمەوە بۆ ئەوان، هەموو ئەو ساتەم هەست پێكرد! ئێرە زەوی بوو، خاڵی بوو لە خلۆربونەوەو كەوتنە خوارەوەی ئینسانیەت. بەرامبەر ئەو خەڵكانە دەژیان كە گوناهیان نەكردبوو. ئەوان تەنها لە بەهەشتێكدا دەژیان كە لەسەر بناغەی تەواوی ئەفسانەكانی بەشەریەت دروست بوبو، لێرە كەسانێك دەژیان كە هەرگیز دەستیان نەبردبوو بۆ گوناحكردن و هەر لەو بەهەشتەدا دەژیان كە دایكی و باوكی ئێمەی تیادا دەركرابوو.

ئەم خەڵكە، شادومانانە پێدەكەنین، لە دەوروبەرمدا كۆدەبونەوەو دەیان كردمە باوەشەوە. منیان لەگەڵ خۆیاندا دەبردە ماڵەوە و هەمویان دەیان ویست ئاگاداریم لێبكەن و دڵنەوایم بدەنەوە.

ئاه، ئەوان پرسیاریان لەمن نەدەكرد، بەڵام بەخەیاڵم، ئەوان هەموشتێكیان دەزانی بەبێ ئەوەی بپرسن، دەیانویست بۆ سارێژ بونی نیشانەكانی ڕەنج لە دەموچاومدا پەلە بكەن.

## فەسڵی چوارەم :

دەزانیت بابەتەکە چیە؟ بەڵێ، شایەتی دەدەم کە ئەمە یەک خەیاڵ بوو، هەستی عەشقی پاك و جوانی ئەو خەڵکە بۆ من بە هەمیشەی دەمێنێتەوە، من هەست دەکەم کە هێشتا عەشقیان لێرە بە دەروونمدا دەگەڕێت. من خۆم ئەوانم بینی بوو، ئەوانم ناسیبون و پەسەندم کردبون.ئەوانم خۆش دەویست دواتر دوری ئەوانم تەحەمول دەکرد.ئاه، خێرا تێگەیشتم کە تەنانەت لە زەمانێکدا ئەسڵەن نەمتوانیوە لە زۆربەی شتەکان تێبگەم. هەروەکو ڕوسیەکی نوێخواز و پترزبۆرگێکی پێشکەوتو ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵمدا بەشێوەیەك کە ناتوانرێت بوترێت، زۆر زیاتر دەیان زانی، ئەوان، بۆنمەونە، هیچ زانستێکیان وەکو ئێمە نەبوو.بەلاٚم بە خێرای زانیم کە زانستەکەی ئەوان بە هۆی کەرەستەیەکیی ژێریەوە جیاواز

لەوەی ئێمە کە لەزەویەکەی خۆماندا هەمانە پەروەردە دەبوو، هەروەها ئارەزوەکانیان، بەتەواوەتی جیاواز بون، ئەوان مەیلیان لە هیچ شتێك نەبوو، لە ئارامیدا دەژیان.ئارەزویان بۆ ژیان بەوشێوەیەی کە ئێمە بۆ تێگەیشتن هەمانە ئەوان نەیان بوو.لەبەرئەوەی ژیانیان بێکەم و کورتی بوو.بەلاّم زانسیتی ئەوان بەرزترو قولّتر لەوەی ئێمە بوو، چونکە زانستی ئێمە بە شوێن ڕونکردنەوەی چییەتی ژیانەوەیە، ئارەزوی تێگەیشتنی ئەوەیە کە چۆن ئەوانی تر فێربکات کە عەشق بدەن، لە کاتێکدا ئەوان بەبێ زانست دەیانزانی چۆن ژیان بکەن.من لەوە تێگەیشتم، بەلاّم نەمتوانی زانستەکەیان فێرببم. درەختەکانیان پیشان دەدام، من نەمتوانی عەشقی توندی ئەوان بۆ درەختەکان بزانم. بەشێوەیەك وەك ئەوە وابوو کە ئەوان لەگەڵ بونەوەری وەك خۆیاندا قسە بکەن. بە پێچەوانەوە نابێت وا بیربکەمەوە کە هەڵە دەکەم ئەگەر بڵێم لەگەڵ درەختەکاندا گفتەگۆیان دەکرد.بەڵێ، ئەوان زمانی درەختەکانیان دۆزیبویەوە، من دڵنیابوم لەوەی کە درەختەکان لە مەبەستی ئەوان تێدەگەیشتن. ئەوان بەم شێوەیە سەیری تەواوی سروشتیان دەکرد _ئەو گیاندارانەی کە لە ئاشتی و سەفادا لەگەڵ

ئەواندا دەژیان هێرشیان بۆ نەدەکردن، بەڵکو ئەوانیان خۆش دەویست، کەوتبونە داوی عەشقی ئەوانەوە. ئەوان ئیشارەتیان بۆ ئەستێرەکان دەکردو چەند شتێکیان لەبارەی ئەوانەوە بە من دەوت کە من نەمدەتوانی تێبگەم، بەڵام دڵنیابوبوم کە ئەوان تا سنورێك لەگەڵ ئەستێرەکاندا لە پەیوەندیدان، نەك تەنها لەبیروبۆچوندا، بەڵکو بە رێگەی پەیوەندی زیندوو.ئاه، ئەو خەڵکانە پێداگریان لەسەر ئەوە نەدەکرد کە هەوڵی ئەوە بدەن کە من تێبگەیەنن، ئەوان بەبێ ئەمە منیان خۆش دەویست، بەڵام من دەمزانی کە ئەوان هەرگیز لەمن تێناگەن، بەرامبەر بەمە من بەدەگمەنی لەبارەی زەویەکەمانەوە قسەم بۆ دەکردن.من تەنها لە حزوری ئەواندا زەویەك کە لەسەری دەژیان ماچم دەکرد و بێ قسە خودی ئەوانم دەپەرست. ئەوان ئەمەیان دەبینی و مۆڵەتیان پێدەدام بەبێ هیچ شەرمەزاربونێك لە پاڕانەوەکەمدا بیانپەرستم.لەبەر ئەوەی خۆیان توانای خۆش ویستنیان هەبوو.هەندێك جار کاتێك بە فرمێسکەکانم ماچی پێیەکانیانم دەکرد لێم نەدەڕەنجان، شادومان بون لەبەرئەوەی بە ئاگابون لە عشقێك کە بەهۆیەوە وەڵامی عەشقەکەی منیان دەدایەوە.

هەندێک جار بەسەرسامیەوە لە خۆمم دەپرسی چۆن دەبێت ئەوان لە توانایاندا نەبێت کە ئازاری بونەوەرێکی وەکو من بدەن، هەرگیز تەنانەت بۆ یەکجاریش هەستی ئیرەیی یان ئاواتخوازیان بەمن نەدەبرد. زۆر جار بەپێچەوانەوە لە خۆمم دەپرسی چۆن دەکرێت بە وجودی ئەمەوە کەسێکی بەخیل و درۆزن بم، هەرگیز لەگەڵ ئەواندا لەبارەی ئەوەی کە دەمزانی _ ئەڵبەتە کە ئەوان نەیاندەهێنایە بەرچاویان _ قسەم نەدەکرد، ئەوەی کە هەرگیز واس واس نەدەبوم یان بە پێچەوانەوە حەزبکەم ئەوان سەرسام بکەم یان تەنانەت بۆ سود وەرگرتن لێیان ئەم کارە بکەم.

ئەوان هەروەکو منداڵە خۆشحاڵەکان و عەجولەکان وابون. لە دارستان و دەوەندەکاندا سەرگەردان بون، گۆرانیان لەبارەی دڵبەستەگی و گیرۆدەیەوە دەوت. خواردنەکانیان سوک بون _ میوەی درەختەکان، هەنگوینی شاخەکان و شیری ئەو حەیوانانەی کە ئەوانیان خۆش دەویست.کارێک کە بۆ دابینکردنی خواردن و پۆشاکەکانیان ئەنجامیان دەدا کەم و سوک بوو.ئەوان منداڵەکانیان خۆشدەویست و زاوزێیان دەکرد، بەڵام من هەرگیز لەواندا لە وجودی ئەو ئارەزوە بێڕەحمانە کە تەقریبەن بەسەر هەمو خەڵکی ئەم

زەویەدا زاڵ دەبێت و سەرچاوەی هەمو گوناهەکانی بەشەریەتە لەسەر زەوی تینەگەیشتم.

ئەوان بەهۆی هاتنی منداڵەکان بە شێوەی بونەوەری تازە بۆ دابەشکردنی شادیەکانیان خۆشحاڵ بون. هیچ جەنگ و ئیرەیەك لەنێوان ئەواندا نەبوو. تەنانەت مانای ئەو وشانەشیان نەدەزانی.منداڵەکانیان ڕۆڵەی هەمویان بون، لەبەرئەوەی کە ئەوان هەمویان بەیەکەوە یەك بنەماڵەیان ڕێکدەخست. بە کەمی بیماری لە نێوان ئەواندا ڕویدەدا، ئەگەر چی مەرگ وجودی هەبوو، بەڵام بەتەمەنەکان لە ئارامیدا دەمردن، وەکو ئەوە وابو کە دەڕۆیشتنە خەوەوە، بۆ کۆتا خوداحافیزیان بە پێکەنینە دڵنیایەکانیانەوە دوعای خێریان بۆ کەس و کارەکەیان دەکرد.

من لەو ماوەیەدا هەرگیز خەم و فرمێسکم نەبینی، مەگەر تەنها عەشق، کە بە خاڵی خۆشی و چێژێکی تەواو دەگەیشتیت، چێژێکی ئارم، کە بێ بیرکردنەوە و کەموکوڕی بوو. لەوانەیە ئێوە بیربکەنەوە کە ئەمانە لە دوای مەرگی یەکترەوە لەگەڵ مردوەکاندا لە پەیوەندیدان، یەکگرتنەوەی زەوی ئەوان بەهۆی مەرگەوە تەواو نەبوە. لەکاتێکدا لەبارەی ئەبەدیەتەوە پرسیارم لەوان دەکرد بە

سەختی لە مەبەستم تێدەگەیشتن، بەڵام بێگومان تا ڕادەیەکی زۆر بۆیان ئاشکرادەبوو کە تەنانەت پرسیارێکی لەو بابەتە لە زەنیاندا نەبوو. ئەوان پەرستگایان نەبوو، بەڵام ژیانێکی واقیعی و هەستی نەوەستانی بونێکیان بە هەموو جیهانەوە هەبوو. هیچ دین و ئاینێکیان نەبوو، بەڵام بە تەواوی وجودیانەوە بە ئاگا بون لەوەی کە کاتێك چێژی زەویەکەیان بە ئەوپەڕی سروشتی زەوی گەیشت، ئەوکاتە بۆ ئەوان و بۆ مردوەکان و زیندوەکان، پەیوەندیەگی زۆرترو کامل تر لەمە بە هەمو جیهانەوە کۆ دەبێتەوە.بەڵام وادەهاتە بەرچاو کە لە دڵیاندا پێشبینیان دەکرد، لەبارەی ئەمەوە بەیەکەوە قسەیان دەکرد.

شەوەکان پێش خەوتن حەزیان دەکرد بەیەکەوە گۆرانی بڵێن بۆ ئەو ڕۆژەی کە تێپەڕیوە و ئەو شادیەیی کە بەوانی بەخشیوە قەدری بزانن و دواتر خودا حافیزی لێبکەن.

ئەوان ئاوازی ستایشی سروشت و دەریاو دارستانەکانیان دەوت.حەزیان دەکرد گۆرانیەکانیان لەبارەی یەکترەوە بێت، ستایشی یەکتری بکەن هەروەکو منداڵەکان.ئەم گۆرانیانە سادەترین ئاواز بون، کە لە دڵی ئەواندا دەکوڵاو بەرەو دڵێکی تر دەڕۆیشت.

نەک تەنها لە گۆرانیەکانیاندا بەڵکو لە تەواوی ژیانیاندا وادەردەکەوت کە کاریان جگە لە ڕێکخستنی یەکتر هیچی تر نیە.وەکو ئەوە وابون کە عاشقی یەکتربن.بەڵام هەستی، گشتگیری و داگیرکردنی جیهانیان هەبوو.

هەندێک لە گۆرانیەکانیان ئەوەندە پڕ هەیەجان و بەهێزبون کە من تەنانەت بەسەختی دەمتوانی لێیان تێبگەم.ئەگەر لەوشەیەکیش تێبگەیشتبمایە، هەرگیز نەمدەتوانی واتای تەواوی ئەوە بزانم. بەو شێوەیەی کە هەبوو، لەدەرەوەی زهنی مندا دەمایەوە. زۆرجار بەوانم دەوت کە من زۆر زیاتر هەستی ڕودانی ئەمەم هەبوە، کە لە زەویەکەی خۆماندا ئەم جوان و شادیە بەشێوەی ئارەزویەکی خەماوی بەرەولام دەهات و هەستم پێدەکرد، کە هەندێک جار بەخەمێکی تەحەمول نەکراو دەردەکەوت.بەشێوەیەک کە لە پێش هەمو ئەواندا لە خەیاڵی دڵم و وێنەکانی زهنمدا دەمزانی، لەوەی کە زۆرجار لە زەویەکەماندا نەمدەتوانی بەبێ گریان سەیری ئاوابونی خۆر بکەم... لەوەی لەنەفرەتکردنم لە خەڵکی زەویەکەمان هەمیشە هەستی دڵتەنگی وجودی هەبوو: بۆچی نەمدەتوانی بێزاربم لەوان بەبێ ئەوەی ئەوانم خۆش بوێت؟ بۆچی نەمدەتوانی ئەوان ببەخشم؟

له عشقم سەبارەت بەوان هەستێکی خەماوی هەبوو: بۆچی نەمدەتوانی ئەوانم خۆش بوێت بەبێ ئەوەی لەوان بێزاربم؟ ئەوان گوێیان بۆ من دەگرت، دەمبینی کە ناتوانن ئەوەی کە دەیلێم لێیی تێبگەن، بەڵام من لە بارەی ئەوەوە کە قسەم بۆ کردبون پەشیمان نەبوم: دەمزانی کە ئەوان تێدەگەن لەو دڵتەنگیە توندەی کە من هەمبو بۆ ئەو کەسانەی کە جێم هێشتبون.بەڵام کاتێك بە چاوە شیرینە پڕ لە عەشقەکەیان سەیری منیان دەکرد، ئەو کاتەی کە من لەگەڵیاندا هەستم بەوە دەکرد، دڵم وەکو ئەوان پاك و بێ فێڵ بوو، هەستی بێکەم و کوڕی ژیان هەناسەمی بڕی، من لە بێدەنگیدا ئەوانم دەپەرست.

ئاه، ئێستاکە هەمو لە دەموچاومدا پێدەکەنن، دڵنیایان پێدەدام کە کەسێك ناتوانێت خەیاڵێك بەم هەموو وردەکاریانەوە کە ئێستە دەیگێڕمەوە ببینێت.

ئەوان لەو باوەڕەدان کە من تەنها خەیاڵێکی هەستی کە لە عالەمێکی گوماناویدا هەیە لە دڵمدا هەستاوەتەوە، هەبوە یان هەستم پێکردوە و کاتێك کە هەستاومەتەوە خۆم وردەکاریەکانم بۆ دروست کردوە. زەمانێك کە بەوانم وت لە ڕاستیدا ئەمە چۆن بوە،

خودای من، چەند پێکەنینێکیان لە بەرامبەرمدا کرد، بومە هۆکاری

چەند شادیەک! ئەڵبەتە ڕاستە کە من تەنها کەوتوبومەتە ژێر

هەستی خەیاڵەکەمەوە، ئەمە هەمو ئەو شتە بو کە لە دڵی مندا بە

برینێکی توندەوە مابویەوە. بەڵام گرفت و وێنەی ڕاستی

خەیاڵەکەم، ئەو شتانەی کە من لە ڕاستیدا لە کاتی خەیاڵەکەمدا

بینیمن، بە چەند ڕێك و پێکیەکەوە هەمویان بەیەکەوە بون،

ئەوەندە بە شێوەیەکی دڵڕفێن و خۆشەویست و واقیعیەوە دەهاتنە

بەرچاو، کاتێك کە هەستامەوە، ئەڵبەتە بێدەسەڵاتر لەوەبوم کە

ئەوان بە زمانی داماوانەی خۆمان باس بکەم، تا شوێنێك ئەمانە بە

ناچاری لە زهنمدا شوێنەواریان نەماو لەناوچون. بەرامبەر بەمە ڕێی

تێدەچێت کە من دواتر لە ڕاستیدا ناچاربم وردەکاریەکان دروست

بکەم، ئەڵبەتە ئەمانە بە خواستی پڕ لەهەستم هەڵبگەڕێنمەوە

تاوەکو بتوانم لانی کەم بەشێك لەوان تا شوێنێك کە دەمتوانی بە

خێرایی بگوێزمەوە. بەڵام لەلایەکی ترەوە، چۆن دەمتوانی ئەوانە

ڕازی بکەم تاوەکو بڕوابکەن هەمو ئەم شتانە حەقیقی بوە؟ لەوانەیە

هەزاران جار ڕونتر، خۆشحاڵتر و شادتر لەوەی کە باسم کردبوو.

ئەگەر خەیاڵبون ئەمەی بە مسۆگەر دەزانی، دەبوایە ئەمە هێشتا خەیاڵێکی حەقیقی بێت.

ئەگەر بە مسۆگەری دەزانی کە من ئەمەم لە خەیاڵدا بینیوە، دوبارە دەبوایە ئەم خەیاڵە واقعی بوایە. دەزانیت، شتێکتان بۆ باس دەکەم: لەوانەیە ئەسڵەن ئەمە خەیاڵ نەبوبێت!

لەبەرئەوەی ئەوکاتە شتێکی ئاوەها ترسناک، ڕاستیەکەی ئاوەها وەحشناک ڕویی دەدا، کە نەدەکرا لە خەیاڵدا وێنەی بکەیت، لەوانەیە دڵی من لە خەیاڵدا گەشەی کردبێت، بەڵام ئایا دوای ئەمە هەمو دڵی من بە تەنهای دەیتوانی لەم ڕوداوە ترسناکە کە بۆ من ڕویدابوو گەشەبکات؟ چۆن دەمتوانی ئەمە بە تەنها دروست بکەم یان لەخەیاڵەکەمدا گەشەی پێبدەم؟ ئایا دڵی بچوکی من و زەینی هەڵاتوم و کەم مایەم بە درکاندنی حەقیقەتی ئەمە یەک دەگرێتەوە؟ ئاه، بۆخۆتان بڕیار بدەن: تاوەکو ئێستە ئەمەم شاردوەتەوە، بەڵام ئێستە حەقیقەتەکە دەڵێم. ڕاستیەکەی ئەمەیە کە من. . .هەمو ئەوانەم بەرەو خراپی بردبون!

## فەسڵی پێنجەم :

بەڵێ، هەمو ئەمانە بەهۆی منەوە بەرەو خراپی ڕۆیشتبون! ئێستە لەبیرم نایەتەوە کە بۆچی بەم شێوەیە بوو، بەڵام دڵنیام کە هەڵەناکەم.ئەم خەیاڵەی من هەزاران ساڵ دەستی پێکردبوو تەنها بەوە گەیشتبوو کە من هۆکاری تیاچونی ئەوان بوم.وەك کرمی ناو ڕیخۆڵەیەکی پیس، هەروەکو میکرۆبی تاعون ناوچەکەیانم گیرۆدە کرد، بەرانبەر ئەمە تەواوی ئەو زەویەم ئالودە کرد، زەویەك کە لە پێش هاتنی مندا زۆر پاك و خاڵی بوو لە کوناح. ئەوان فێری ئەوە بون کە چۆن درۆ بکەن، بە خوگرتن بە درۆوە گەورە بون، دڵڕفێنی درۆیان ئاشکرا کرد.ئاه، لە سەرەتاوە بە ڕێك و پێکی دەستی پێکرد، بە خۆشیەك، بە غەمزەیەك، بە یاریەکی عاشقانە، لەوانەیە لە ڕاستیدا بە یەك میکرۆب، بەڵام ئەم میکرۆبە ڕێگەی درۆی خۆی

بەرەو دڵی ئەوان کردەوە و ئەوانی بە شێوەیەکی تووڕەو سەخت دروست کرد. دواتر ئارەزوکردن زۆر بە خێرایی سەریهەڵدا، ئارەزو ئیرەیی دروست کرد، ئیرەیی _ بێڕەحمیی... ئاه، نازانم، لەبیرم نایەتەوە. بەڵام زۆر زوو، زۆر زوو یەکەمین خوێن ڕژا. ئەوان سەرسام و ترسابون، کەم کەم لەیەکتر بڵاوبونەوە و دەستیان کرد بە جیابونەوە لە یەکتری. ئەوان بۆ خودی کۆمەڵگاکان بچوکترین ڕێکخستنیان دەدا، بەڵام هەریەکێکیان لە دژی ئەوی تر. بەشوێن ئەمەدا، سەرزەنشت کردنەکان و سەرکوت کردنەکان دەستیان پێکرد. شەرمیان ناسی و بەشتێکی باش دایانا، تێگەیشتن لە شەرەف دەرکەوت، هەریەکە لە کۆمەڵگاکان ئاڵای خۆیان هەڵکرد. دەستیان کرد بە ئازار دانی حەیوانەکان، حەیوانەکان دورکەوتنەوە لەوان و پەنایان بردە بەر دارستانەکان و بونە دوژمنی ئەوان. داوای جیابونەوەیان لە یەکتری کرد، بۆ گۆشەگیری، بۆ فەردیەت، بۆ منیی و تۆیی. دەستیان کرد بە قسە کردن بە زمانە جیاوازەکان. بە خەم و خەفەت ئاشنابون و پەژارەیان خۆش ویست. تامەزرۆبون بۆ ڕەنج کێشان. دەیان وت تەنها لەڕێگەی ڕەنج کێشان و ئازارەوە دەکرێت بە هەقیقەت بگەیت.

دواتر زانست دەرکەوت، بەو شێوەیەی کە چەپەڵکردەبون دەستیان کرد بە قسەکردن لەسەر برایەتی و ئینسانیەت، ترکیان بەم مانایانە کرد، بەوشێوەیەی کە دەبونە جەنایەتکار، عەدالەتیان داهێناو تەواوی داوەریەکانیان هێنایە ئاراوە تاوەکو ڕێزدارین و بۆپارێزگاریکردن کەرەستەی کوشتنیان دروست کرد. ئەوان بەسەختی لەبیریان مابویەوە کە چ شتێکیان لە دەست داوە. لە ڕاستیدا نەیاندەویست کە باوەڕبکەن ڕۆژێک شادو پاک بون، تەنانەت، شێوەی بونی خۆشیەکی لەوەیان لە ڕابردودا بە گاڵتەوە گرتبوو، ئەوەیان بە خەیاڵێک دەزانی، نەیاندەتوانی بە شێوەیەکی ڕون وێنەی بکەن، سەیر لەمەدایە ئەگەر چی هەمویان ئیمانیان بە ڕابردوی خۆیان لەدەست دابوو بەڵام ئەمەیان بە ئەفسانەیەک دەزانی. بەڵام بە ڕادەیەکی زۆر لە چاوەڕوانی دوبارەبونەوەی خۆشی و پاکیدابون کە هەروەکو منداڵەکان بە شەوقی ئەمەوە سەریان خواردەکردەوە، بتیان لەمە دروست دەکرد، پەرستگەیان دەکردەوە وبیرو بۆچون و نیازەکانیان دەپەرست. ئەگەر چی لە سەرەتادا لەو باوەڕەدابون کە ئەمە بەدەست نایەت و ناگونجێت، بەم حاڵەوە کڕنوشیان بۆ دەبردوو بە ڕقەوە دەیان پەرستی! ئەگەر

چی، بە جۆرێك ئەو دۆخە وجودی هەبوو کە چۆن بگەڕێنەوە بۆ ئەو پاکی و شادیەیی کە لەدەستیان دابوو، لە کاتێکدا کە کەسێك ئەم ڕێگەیەیی دوبارە بەوان پیشان دەدا لێیی دەپرسین کە ئایا ئارەزوی گەڕانەوەتان بۆ ئەو کاتە هەیە یاخود نا، بە شێوەیەکی تەواو پەسەندیان نەدەکرد. ئەوان وەلامی منیان دایەوە: ((لەوانەیە ئێمە فێڵباز، خراپ و بێویژدان بین، بەلام ئێمە ئەمە دەزانین و بەهۆی ئەمەوەیە کە دەگرین و پەرۆشین، خۆمان ئازار دەدەین زیاتر لەوەی کە داوەرێکی بێڕەحم کە نایناسن بیەوێت لەبارەی ئێمەوە داوەری بکات.بەلام ئێمە زانستمان هەیە، بەهۆی ئەمەوە هەقیقەت دەدۆزینەوە و بە ئاگایەوە پێی دەگەین.زانست لە هەست گەورەترە، بە ئاگابون لە ژیان لە خودی ژیان گەورەترە، زانست وردەکاریەکانمان دەداتێ، بەهۆی وردەکاریەکانەوە هەموو شتێك ئاشکرا دەکەین، بە ئاگابون لە یاساکانی خۆشبەختی لە خودی خۆشبەختی گەورەترە.))

ئەمە ئەو شتانە بو کە ئەوان وتیان، دوای وتنی چەند شتانێکی لەم جۆرانە هەمویان دەستیان کرد بە عەشق دان بە خودی بەشەریەت، بەلام لە ڕاستیدا بەهیچ شێوەیەك بە کردەوەکانیان

نەیاندەکردو هەرگیز نەیان دەتوانی بیکەن.هەمویان هەوڵی ئەوەیان دەدا کە کەسایەتی خۆیان ببەنە سەرەوە کەسایەتی ئەوانی تر عەیبداریکەن، هەمویان بە ماف تاکە کەسی خۆیان ئیرەیان دەبر کە لە کۆتایدا هەوڵەکانیان لەناوبردنی ئەمە بوو لەوانی تردا، ئەمەیان کردبویە بنەمای ژیانی خۆیان.

بەشوێن ئەمەدا کۆیلایەتی هات، تەنانەت کۆیلەبون بە ویستی خۆی، لاوازەکان بە خواستی بەهێزەکان خۆیان دەدا بەدەستەوە تەنها بە مەرجێك کە یارمەتی بدرێن ئەوانەی کە لە خۆیان لاوازتر بون، بەزنجیری کۆیلایەتی بکێشرێن.دواتر فریشتانێك هەبون کە دەنێردران بۆ خەڵکەکە، بە حاڵەتێکی ڕقاویەوە لە غروری ئەم خەڵکە قسەیان دەکرد. قسەیان دەکرد لە نەبونی ڕێکو پێکی و نەبونی یەکبون و گونجاندنیان، بەداخەوە بون بۆ ئەوەی کە حەیا لە نیوانیاندا نەمابوو. بەڵام خەڵك بەمانە پێدەکەنی یان بەردیان بەرەو ڕویان هەڵدەدا. لەبەر دەرگای پەرستگەکەدا خوێنی پیرۆز دەڕژا.

دواتر چەند خەڵکێك داوایانکرد کە بەیەك گرتنەوە دوبارە خەڵك بیردەکاتەوە، تاوەکو شوێنێك کە هەرکەسێك بەجۆرێك ڕەفتاربکات کە نەبێتە هۆی بێزارکردنی ئەوانی تر، هەمویان لە شوێنیکدا وەکو

کۆمەڵگایەکی یەکانگیر بژین.دواتر جەنگە پەیتاپەیتاکان بەسەر ئەم بیروبۆچونانەدا سەریان هەڵدا. تەواوی شۆڕش گێڕو خەبات گێرەکان سوربون لەسەر ئەو بیروبۆچونەی کە زانست، عەقلّ و مانەوەی غەریزەی خود لە کۆتایدا خەڵك ناچار دەکات کە پەیوەست بن بە کۆمەڵگایەکی یەگانگیرو شیاو. بەرامبەر بەمە، ((عاقڵەکان)) بۆ بنبڕکردنی هەرچی خێراتری (( گەمژەکان)) ئەو کەسانەی کەس لەبیرورایان تێنەدەگەیشت تاوەکو شوێنێك کە دەگونجا هەوڵیان دەدا، تاوەکو گەمژەکان نەبنە کۆسپی پیرۆزی ئەوان. بەڵام مانەوەی غەریزەی خود بەخێرای لاواز بوو. چەند خەڵکێکی لە خۆبایی و هەوەسباز ئەوانەی کە یان. داوای هیچیان نەدەکرد یان داوای هەموشتێکیان دەکرد دەستیان کرد بە ڕاپەڕین کردن.بۆ بەدەست هێنانی هەموشتێك دەستەودامێن بون بۆ جەنایەت کردن، ئەگەر سەرکەوت و نەبونایەوە خۆیان دەکوشتەوە. چەند مەزهەبێکی جۆراوجۆر هاتن کە بون و نەبون و خودی وێرانکاریان تەفروتونا کرد بۆ گەیشتن بە ئارامیەکی ئەبەدی. کۆتایەکەی ئەم خەڵکە لە ڕەنجی بێمانای خۆی ماندوو بوبو، شوێنەواری مەینەت و چەرمەسەری لە دەموچاویاندا دەرکەوت، ئەو کاتە ئەوان دەیان وت

که مەینەت جوانیەکە، بۆچی لە مەینەتدا بە تەنها مەعنا وجودی مەبوو. ئەوان لە گۆرانیەکانیاندا مەینەتیان پەسەند کرد. من لە نێوانیاندا پرسەم دەگێڕا، دەستەکانم دەگوشی و بۆیان دەگریام، بەلاّم من ئەوانم خۆش دەویست، لەوانەیە لە دەورانی ڕابردودا ئەوکاتەی کە هیچ ڕەنجێك و مەینەتێك لە دەموچاویاندا دەرنەدەکەوت و پاك و خۆشەویست بون.من بەو زەویەی کە ئەوان پیسیان کردبو عەشقم دەدا تەنانەت زیاتر لەوکاتەی کە بەهەشتێك بوو، ئەگەر چی تەنها لەبەر ئەو خەمە بوو کە ئەوانی گرتبویەوە.

بەداخەوە! من بەردەوام خەم و مەینەتم خۆش دەویست، بەلاّم تەنها بۆ خۆم، بۆ خۆم، بەلاّم من بۆ ئەوان گریام و خەمبار بوم. بە نائومێدیەوە باوەشم بۆ کردنەوە و خۆم سەرزەنشت کردو جنێوم بە خۆم دا. پێم وتن کە هەموی کاری من بوو، خۆم بە تەنیا. ئەوە من بوم کە خراپی، پیسی و درۆم بۆ هێنان. داوام لێکردن کە لە خاچم بدەن و فێرم کردن کە چۆن سەلیبێك دروست بکەن. نەمدەتوانی خۆم بکوژم، توانایی ئەوەم نەبوو. بەلاّم دەمویست بە دەستی ئەوان تامی ئازار بچێژم. ئارەزوی مەینەت کێشانم هەبوو چاوەڕێی ئەوە بوم کە خوێنم تاوەکو کۆتا دلۆپ لەم دەردو ڕەنجەدا تەواو ببێت.

بەڵام ئەوان تەنها پێمپێدەکەنین، بە شێتیان دادەنام. منیان لە تەواوی ئەو هەڵەیە بە پاك دەزانی و دەیان وت کە هەرچییەك خۆیان ویستویانە بە دەستیان هێناوە و ئەگەر شوێن وپاروودۆخێکی تر جیا لەمە وجودی هەبێت، بۆ ئەوان نابێت و سەرناگرێت! لەکۆتاییدا پێیان دەوتم کە بۆ ئەوان ترسناك بوم و ئەگەر ئاگام لە زمانم نەبێت ئەوە ناچار دەبن کە لە شێتخانەدا زیندانیم بکەن. دواتر خەمێك ڕۆحمی گرتەوە و دڵمی گوشی و هەستم کرد کە خەریکە گیان دەدەم، دواتر... لەخەو هەستامەوە.

بەیانی بوو، مەبەستم ئەوەیە کە هێشتا ڕۆژ نەبوبویەوە، بەڵام نزیکی سەعات شەش بوو. لەسەر ئەو مۆبیلەی کە خەوتبوم هەستامەوە.گڵۆپەکە بەتەواوەتی سوتابوو. هەموو دانیشتواتی ژوری ئەفسەرەکە خەوتبون، بێدەنگی هەمو شوێنێکی گرتبویەوە، یەکەمین ڕوداو کە ڕویدا، ئەوەبو کە من بە پەشۆکاویەوە لەخەو دەرپەڕیم.تاوەکو ئێستە ڕوداوێکی لەم جۆرە ڕوی نەدابوو بۆم، هەرگیز، بۆنمەنە، بەم شێوەیە من لەسەر مۆبێل خەوم لێبکەوێت.لەکاتێکدا کە ڕاوەستابوم و خەریك بو دەهاتمەوە هۆش خۆم چاوم بە دەمانچەکەم کەوت لەسەر مێزەکە کە پڕو ئامادەبوو.

بەلام ئەوم فرێدا! ئاه، ئێستە دەمەوێت بژیم، بژیم! دەستەکانم بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و لەبەردەرگای حەقیقەتی ئەبەدیدا دوعام کرد، نا، دوعام نەکرد، هەستم بە شادیەك کرد کە فرمێسك بە گۆناکانمدا هاتنە خوارەوە، بێئاگایی تەواوی ڕۆحمی گرتبویەوە.بەڵێ، بژیم و نامەی کردەوەکەم بەدەست بهێنم! ئاه، لەچاوتروسکادنێکدا بڕیام دا کە ژیانم بە ناساندی هەقیقەتی ئەبەدی تەواو بکەم، لەبەر ئەوی من حەقیقەتەکەم بینیوە، من بە چاوەکانی خۆم ئەوم بینیوە، ئەوم بەتەواوی شکۆ و گەورەیەوە بینیوە.

لەمە بەدواوە من لە حاڵەتی ئامۆژگاریکردندام! سەرەڕای ئەمەش ئەو کەسانەی کە بە من پێدەکەنن زیاتر خۆشم دەوێن.بۆچی بەم جۆرە ناتوانم و نازانم باسی بکەم، بەلام بەمجۆرەیە. پێم دەڵێن کە ئالۆز و نادیارم، ئەگەر ئێستە ئالۆزو نادیارم، ئەی کەواتە دواتر چیم؟ لە هەقیقەتدا ئەمە ڕاستە: کە من ئالۆز و نادیارم، لەوانەیە بەوجۆرەی کە زەمەن تێدەپەڕێت زیاتر بەم شێوەیەبم. ئەڵبەتە دەکرێت پێش ئەمە وتاری دینی بدەم و زمانم زیاتر بگیرێت، مەبەستم ئەوەیە کە، فێرببم چ وشەیەك بڵێم و چ کارێك ئەنجام بدەم، لەبەرئەوەی وتاری دینی فەرمانێکی سەختی دژوارە. هەمو

ئەو شتانە بۆ من وەکو ڕۆژی ڕوناك وابوو، بەلام، گوێبگرن. چ کەسێك هەڵە ناکات؟ بەهۆی ئەمەوە ئێوە دەزانن کە هەموان بە ئامانجێکی یەکسانەوە هەڵە دەکەن، بەهەرحاڵ هەموان لە یەك بواردا تێدەکۆشن، لە زاناو گەورەکانەوە بیگرە تاوەکو گەمژەو شرەخۆرەکان، هەمویان دوچاری هەڵە دەبنەوە، لە کارە جیاوازەکانیاندا. ئەمە هەقیقەتێکی کۆنە بەلام دەزانیت، کام هەڵە بۆمن تازەیە؟من ئیتر لە هەڵەکان دورکەوتومەتەوە، لەبەرئەوەی هەقیقەتم بە ڕاستی بینیوە و دەزانم کە خەڵك دەتوانن جوان و خۆشحاڵ بن بەبێ ئەوەی هێز و دەسەڵاتی ژیان لەسەر زەوی لە دەست بدەن. من نامەوێت و ناتوانم بڕوابکەم کە چەپەڵی دۆخی ئاسای بەشەریەتە. تەنها ئەمە بیروڕای منە کە ئەوان پێی پێدەکەن. بەلام چۆن دەتوانم بڕوا بمە بکەم؟

من هەقیقەتم بینیوە. بەو شێوەیە نیە کە ئەمەم بە زهنی خۆم دروست کردبیت، من ئەوم بینیوە، بینیومە و وێنەی زیندوی ئەو ڕۆحمی بۆ هەمیشە پڕکردوەتەوە.من ئەوم لە تەواوکاریەکی وەهادا بینیوە کە ناتوانم بڕوابکەم کە بونی بۆ خەڵك نەگونجاوە. بەرانبەر ئەمە دەکرێت چۆن هەڵە بکەم؟ دەکرێت هەڵەکاریم هەبێت، بەلام

گومانێك لەودا نیە، دەكرێت بە زمانێكی ناوەند قسەبكەم، بەلاّم نەك بۆ ماوەیەكی درێژخایەن: وێنەی زیندوی ئەو شتەی كە بینیبوم هەمیشە لەگەلّمدا دەبێت و ڕێنوێنیم دەكات.

ئاه، پڕم لە خۆشی و بوێری، بەم شێوەیە بەردەوامی پێدەدەم و تەنانەت ئەگەر بۆ هەزاران سالّیش بێت! لەبیرتە كە سەرەتا دەمویست ئەم حەقیقەتە بشارمەوە كە ئەوانم بەرەو خراپی بردبوو، بەلاّم ئەمە هەلّەیەك بوو _ یەكەمین هەلّەم!

بەلاّم حەقیقەتەكە لە گوێمدا دەزرنگایەوە لەكاتێكدا كە درۆم دەكرد، پارێزگاری لێدەكردم و ڕاستی دەكردمەوە. بەلاّم چۆن دەكرێت بەهەشتێك دروست بكەیت _ من نازانم، چونكە نازانم چۆن چۆنی ئەمە بلّێم. لەدوای خەیالّەكەمەوە هەلّبژاردنی وشەكان لەدەستم دەرچون. بەهەرحالّ هەمو وشە گرنگەكانم لە دەست داوە، بەلاّم گرنگ نیە، دەڕۆم و بەردەوامی دەدەم بە قسەكردن، دەست لەم كارە ناكێشمەوە، ئەگەر چی من ئەمەم بە چاوەكانم بینیوە، بەلاّم بۆ ناتوانم باسی بكەم كە چ شتێكم بینیوە. بەلاّم گەپجارەكان هەرگیز ناتوانن لەمە تێبگەن. ئەمە خەیالّێك بوو، ئەوان دەلّێن، گالّتەجارپیە، خەوت بینیوە، خەیالاّتە.

ئاه! ئەوان زۆر لە خۆباین! بەڵام خەیاڵ، ڕاستی خەیاڵ چییە؟

ئایا تەواوی ژیانی ئێمە خەیاڵێك نیە؟ باوادابنێین کە ئەمە هەموو خەیاڵێك بووە و هێنانی بەهەشت بۆ سەرزەوی هەرگیز نابێت و ناکرێت، بەم حاڵەشەوە، من بەردەوام دەبم لە وتاردان و هەرگیز ماندونابم، چونکە ویستن ئەوەندە سادەیە، کە دەکرێت لە ڕۆژێکدا یان تەنانەت لە یەك کاتژمێردا هەموو شتێك واقیعیەت بدۆزێتەوە! بابەتە سەرەکیەکە ئەمەیە کە ئەوانی ترت وەکو خۆت خۆش بوێت، ئەمە هەموو شتێکە. هیچ شتێکی تر لە ئێوە داوانەکراوە.

دوبارە ئەمە هەقیقەتێکی کۆنە کە ملیۆنەهاجار وتراوەو وتراوە، بەڵام هێشتا بەشێك لە ژیانی ئێمەی ڕێکنەخستوە! ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە لەگەڵ ئەم بیروباوەڕەدا بجەنگین: ((تێگەیشتن لە ژیان، گەورەترە لە خودی ژیان، ناسینی یاساکانی خۆشبەختی، گەورەترە لە خودی خۆشبەختی.))

ئەگەر ڕۆژێك هەموو خەڵك لە دژی ئەم بیروبۆچونە یەك بگرن، ئەوکاتە گەیشتون بە ئامانج.

ناونیشانی کچە بچوکەکەم پەیداکردوە، دەڕۆم بۆ ئەوێ. بەڵێ، هەر ئێستە دەڕۆم بۆ ئەوێ.

کۆتایی

